# موجەلی بنەماکانی

# عقیدەی تەوحید



نوسینی: د ناصر عبدالکریم العقل

وەرگیرانی: مصطفى محمد جعفر

١٤٤٢ کوچی _ ٢٠٢٠ زاینی

# موجەلی بنەماکانی عەقیدەی تەوحید

وسینی:

د. ناصر عبدالكريم العقل

وەرگێڕان و ڕونکردنەوەی:

مصطفى محمد جعفر (گوڵپی)

١٤٤٢ کۆچی - ٢٠٢٠ زاینی

ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا، ومن سيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له.

واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له.

واشهد ان محمدا عبده ورسوله، وبعد.

**ئەمە عەرزێکی موجمەلە بۆ بنەماکانی عەقیدەی تەوحید لەسەر رێڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺو سەلەف لە یاوەران و شوێنکەوتووان و زانایان و پێشەوایانی ئوممەت بەچاکە و ئیحسان.**

## ڕێخۆشکردن

عەقیدە لە زمانەوانیدا: عەقیدە لە "عقد" و گرێدان و تۆکمە کردن و ڕەبتکردنە بەهێز و قووەت.

عەقیدە لە زاراوەدا: وە لە زاراوەشدا ئیمان و باوەڕێکی حەق و قەتعی و پتەوە بە "الله" و بەوەی واجب بێت بۆی لە تەوحید و تاعەت و ئیمان و باوەڕ بەفریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و دواڕۆژ و نیشانەکانی قیامەت و ئیمان و باوەڕ بەقەدەر و هەموو ئەوەی سابت و جێگیر بووە لە ئوموری غەیب و ئەخبار و قەتعیات بەعلمیی و عەمەلییەوە.

## بەشی یەکەم

### بنچینەگەل و بنەماگەلێک لە مەنهەجی وەرگرتن و بەڵگەهێنانەوەدا

١- سەرچاوەی عەقیدەی تەوحید قورئان و سوننەتی دروستی پێغەمبەر ﷺ و کۆدەنگی سەلەفی ساڵحە.

٢- هەرچی صەحیح و دروست بێت لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەبوڵکردنی واجب ئەبێت ئەگەر ئاحادیش بێت.

٣- مەرجەع لە تێگەیشتنی قورئان و سوننەتدا دەقگەلی رونکەرەوە و تێگەیشتنی پێشینی چاک و ئەوەیە لەسەر مەنهەج و ڕێبازی ئەوان ڕۆشتووە لە زانایان و پێشەوایان و بانگخوازان، پاشان هەرچی دروست بێت لە زمانی عەرەب، بەڵام بەمەرجی ئەوەی موعارزی ئەوە نەبێ سابت و جێگیر بووە لەوە بەموجەڕەد ئەگەر و ئیحتیمالاتی زمانەوانی.

٤- پێغەمـــبەری خـــوا ﷺ هەمـــوو بنەماکـــانی ئـــایینی روون کردووەتەوە، بۆیە بۆ هیچ کەسێک نییە شتێک دابهێنێت و پێی وابێت کە لە دینە.

٥ – تەسلیم بوون بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم بەزاهیر و باتن واجبە لە شەرعدا، موعارەزەی هیچ شتێک لە قورئـان و سوننەتی دروست بەقیاس و زەوق و کەشف و قسەی هـیچ شێخ و هـیچ ئیمامێک و هاوشێوەی ئەوە ناکرێ.

٦ – عەقڵی صەریح موافق و تەبـایە بـۆ نەقڵـی صـەحیح، و هـیچ دوو قەتعیـیەک لێیـان تێنـاگیرێن هەرگیـزا و هەرگیـز، وە لەکـاتی "توهم"دروست بوونی وەهمـی تێگیـران و تەعـاروزدا نەقڵ "واتە: شـەرع "پێشدەخرێت بەسەر عەقڵدا.

٧ – ئیلتزام و پابەندبوون بەئەلفاز و زاراوەگەلی شـەرعییەوە لە عەقیدەدا و دوورکەوتـنەوە لە ئەلفـاز و زاراوەگەلـی بیـدعی و داهێنـراو واجب ئەبێت.

ئەلفـازی مـوجمەل و نـاڕوون کە ئەگەری هەڵە و راسـتی هەبێـت، واتە: هەڵە و راسـتی هەڵگـرێ، پرسـیار لە واتـا و ماناکەیـان ئەکـرێ، جائەوەی حەق بێت، بەلەفزی شەرعی خۆی ئیسبات ئەکرێ، و ئەوەشی باتڵ بێت رەد ئەکرێتەوە.

٨ – عـصمەت "واتە: پـارێزراوێتی لە هەڵە و تـێکەڵ کـردن "بـۆ پێغەمبەر ﷺ سابت بووە، ئوممەتەکەشی بەکۆ مەعصومە لە کۆبوونەوە لەسەر گومڕاهی. ئەمما بۆ ئاحاد و تاکەتاکەی ئوممەت عـصمەت سـابت نیـیە، و ئەوەی ئیمامەکـان و غەیـری ئەوانـیش راجیـایی و ئیختلافیـان تێیـدا هەیە ئەگێـڕدرێتەوە بـۆ کتـاب و سـوننەت، واتە: بـۆ ئەو دوو

سەرچاوەیە، چونکە مەرجەعی ئەسڵی هەموو راجیایی و ئیختلافێک ئەو دووانەیە، لەگەڵ پۆزشـهێناوەدا بـۆ هەڵەکـار "مخطـئ" لە زانایـان و موجتەهیدینی ئوممەت.

٩ – کەسـانێک هەن لەنـاو ئوممەتـدا قـسەی حەق لە سـەر زمانیانەوە دەرئەچێت و لە خوداوە ئیلهام ئەکرێن، خەونی راست حەقە و بەشێکە لە چل و شەش بەشی نبووەت و پێغەمبەرێتـی، فیراسـەت و بەرچاورۆشنی راست حەقە، ئەمانە لە کەرامات و مـوژدەدەرن بەخێر – بەمەرجـی موافەقەتیـان بـۆ شـەرع – نەک سـەرچاوە بـۆ عەقیـدە و تەشریع.

١٠ – دەمەدەمێ لە دیندا زەمکراوە، موجادەلە بەجـوانترین شێواز رێپێدراوە، و نەهی و رێگری لە رۆچوون لەوەدا کە لە شەرعدا صـەحیح و سابت بێت، فەرمانبەردای واجب ئەبێت.

ئیمساک و زمانگرتنەوە لە رۆچوون لە شتێکدا کە موسڵمان علـم و زانستی پێـی نەبێت واجـب ئەبێت و "تەفـویض" و گێـڕانەوەی زانـستی ئەوەش بۆ زانای خۆی "واتە: بۆ الله سبحـانە "واجب ئەبێت.

١١ – ئیلتــزام و پابەنــدبوون بەمەنهەجــی وەحیــیەوە لە رەد و وەڵامـدانەوەدا واجـب ئەبێـت وەک ئەوەی لە ئیعتقـاد و تەقریـردا واجـب ئەبێت، جا بیدعە بەبیدعە رەدناکرێتەوە و"تفریط" کورترەوی بە "غلـو" و زێدەڕەوی بەرامبەر ناکرێ و عەکس و پێچەوانەکەشی بەهەمان شێوە.

١٢ – هەموو داهێنراوێک لە ئاییندا بیـدعەیە و هەمـوو بیـدعەیەک گومڕاهییە و هەموو گومڕاهییەکیش لە ئاگردایە.

## بەشی دووەم:

**تەوحیدی علمی ئیعتقادی، یان تەوحیدی علمی خەبەری، یان تەوحیدی مەعریفەت و ئیسپات، ناوە بۆ تەوحیدی ربوبییەت و تەوحیدی اسماء و صفات.**

* بەیەکگرتنی خوایەتی "تەوحیدی ربوبییەت" : ئیمانێکی جازم و حەقە بەوەی "الله" بەتاک و تەنها بەخاوەن و خالقی هەموو گێتی و هەموو شت بزانیت و هەروەها هەر ئەویش بەژێنەر و مرێنەر، و کارڕێخەری بوونەوەر بزانیت و باوەڕیشت وابێت هیچ شەریکێکی لە موڵک و پاشایەتی و دەسەڵاتیدا نییە، هەروەک ئەوەی هیچ هاوتاو هاودژ و هاوناو و هاووێنە و هاوشێوە و مونازعێکی لە هیچ شتێک لە خوایەتی و مەعانی و واتاکانی خوایەتی و موقتەزەیاتی ناوەکانی و سیفەتەکانیدا نییە.

ئەم جۆرە لە تەوحید ئیسپاتی حەقیقەتی زاتی خودا و ناوەکان و سیفەتەکانی و کردارەکانی ئەکات وەک ئەوەی لە کتێبە پیرۆزەکەی و سوننەتی پێغەمبەرە بەرێزەکەیدا ﷺ هاتووە.

پێلێنان بەمەدا پێلێنانە بەناوەکان و سیفەتەکان و کردارەکانی "الله" و بەیەکگرتنی پێیان.

١ – ئەسڵ لە ناوەکان و سیفەتەکانی الله دا : ئیسپاتی ئەوەیە الله خۆی بۆ خۆی ئیسپاتی کردووە، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆی ئیسپاتی کردووە، بەبێ " تمثیل " و بەبێ "تکییف" ؛ واتە : بەبێ چواندن و وێناکردن و چۆنایەتی، و نەفی ئەوەی خودا خۆی لە خۆی نەفی کردووە، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ لێی نەفی کردووە بەبێ " تەحریف "، واتە : بەبێ گۆڕینی لەفز یاخود مانای سیفات، و بەبێ " تەحریف " واتە : بەبێ خاڵیکردنەوەی ناوەکان لەسیفات وەک ئەوەی


CamScanner

فەرمویەتی : (ليس كمثله شيئ وهو السميع البصير) لەگەڵ ئیمان بە مەعانی و واتاکانی ئەلفازی دەقەکان و ئەوەی دەلالەتی لەسەر دەکەن.

٢ – تمثيل و تعطيل لە ناوەکان و سیفەتەکانی خوادا کوفرە. ئەمما تەحریف ئەوەی ئەهلی بیدەع ناوی لێدەنێن تەئویل، هەیە کوفرە وەک تەویلاتی "باطنية"، و هەیە بیدعە و گومڕاهی یە وەک تەئویلاتی نەفیکارانی صفات، و هەیە بەهەڵە رووەدا، واتە : هەیە هەڵەیە.

٣ – یەکێتی بوون " وحدة الوجود " و ئیعتقادی حلولی الله لە شتێک لە دروستکراوەکانیدا، یان "اتحاد" و یەکگرتن لەگەڵیدا، هەمووی کوفری گەورەیە و موسڵمان لە ئایین و میللەتی ئیسلام دەردەکات.

٤ – ئیمان بەمەلائیکە بەڕێزەکان بەتێکڕا، ئەمما بەتەفصیل و یەک بەیەک لەوەدا کە بەڵگەی دروست پێی هاتووە لە ناوەکانیان و سیفەتەکانیان و کردەوەکانیان بەپێی زانستی موکەللەف ئەبێت، واتە : ئیمان بەبوونیان و بەناوەکانیان و سیفەتەکانیان و کردەوەکانیان بەگوێرەی زانستی مرۆڤی ژیر و عاقڵ ئەبێت.

٥ – ئیمان بەکتێبەکانی خودا و ئیمان بەوەی کە قورئانی کەریم بەرترینیان و نەسخکەرەوەی کتێبەکانی پێش خۆیەتی، و ئیمان بەوەش کە هەرچی کتێبێک لە پێشیەوە هاتبێت بۆ نەتەوە و سەردەمەکەی خۆی بووە و دواتر تەحریف و گۆڕانکاری بەسەریدا هاتووە، بەڵام قورئان بۆ هەموو خەڵک و بۆ هەموو شوێن و سەردەمێکە و خودا بەڵێنی بە "حفظ" و پاراستنی داوە بۆ هەتا هەتایە، لەبەرئەوە هەر پێڕەویکردنی ئەو " واجب " ە، نەک ئەوەی پێشی ئەو هاتووە.

٦ - ئیمان بە پێغەمبەرانی خودا -صلوات الله وسلامه علیهم- و بەوەی بەرترین و باشترینن لە غەیری خۆیان لە بەشەر، ئەوەی ئیعتقاد و باوەڕی بەجۆرێکی تر بێ غەیری ئەوە، بێگومان کافر بووە و لە دین دەرچووە.

ئەوەی بەڵگەی راست و دروست بەعەین و خودی خۆی هاتووە لەسەر پێغەمبەرێتی لەناویاندا، ئیمان بوون پێی بەدیاریکراوی "واجب" ە، و هەروەها ئیمان بەباقی دیکەشیان تێکرا " اجمالا " و باوەڕ بوون بەوەی محمد پێغەمبەر ﷺ باشترین و ئاخریانە و خودا ناردوویەتی بۆ هەموو خەڵک " واجب " ە.

٧ - ئیمان بەپچڕانی وەحی لە دوای محمد پێغەمبەر ﷺ و بەوەی کە ئەو خاتەم و دواهەمینی پێغەمبەرانە، ئەوەی باوەڕی بەخلاف و پێچەوانەی ئەوەوە بێت کافر و لە ئایین دەرچووە.

٨ - ئیمان بەدوارۆژ و هەموو ئەوەی ئەخبار و ئاساری دروست تێیدا هاتووە و ئیمان بەوەشی پێشی ئەو رۆژە ئەکەوێ لە نیشانەکان "واجب" ە.

٩ - ئیمان بەقەدەر، و بەوەی خێر و شەڕی لە خوداوەیە، ئەوەش بەوە ئەبێت ئیمانت وابێت ئەوەی بڕیار بووە ببێت خودا زانیویەتی ئەبێت بەرلەوەی ببێت و لە "لوح المحفوظ" دا نوسیویەتی و ئەوەشی ویستی لێ بووە ببێت بووە و ئەوەشی ویستی لێ نەبووە ببێت نەبووە، و هیچ شتێکیش نابێ ئیللا ئەوە نەبێ ئەو بیهەوێ، وە ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە و خالقی هەموو شتێکە و هەرچیشی بوێت ئەنجامی دەدات.

١٠ – ئیمـان بەوەی بەڵـگەی دروسـت دەلالـەتـی لەسـەر دەکـات لە غەیبیات وەک عەرش و کورسی و بەهەشت و دۆزەخ و نەعیم و خۆشی و سزا و ناخۆشی گۆڕ و صراط و میزان و غەیری ئەوە بەبێ تەئویلی هیچ شتێک لەوە، و لادان لە مانا حەقیقییەکەی بۆ مانایەکی مەجازی.

١١ – ئیمان بەتکاکردن و شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەران و مەلائکە و سالّحان و غەیری ئەوانیش لە رۆژی قیامەتدا وەک ئەوەی بەدرێژی و تەفصیلی لە بەڵگەگەلە دروستەکاندا هاتووە.

١٢ – بینینـی ئیمانـداران بـۆ پەروەردگاریـان لە مەحـشەر و لە بەهەشتدا حەقە، ئەوەی ئینکاری بکات یان تەویلـی بکـات ئەوە لادەر و گومڕایە، ئەویش " واتە : بینینـی خـودا " لە دونیـادا بـۆ هـیچ کەسێک مومکن نییە.

١٣ – کەڕاماتی ئەولیـا و سالّحان حەقە، هەمـوو کـارێکی "خـارق العـادە" واتە : لە عـادەت بەدەر کەڕامەت نیـیە، بەڵ هەیە جـادووە و هەیە کەهـانەیە و هەیە عەڕافەیە و هەیە نجـومگەرییە و هەیە "ئیستدڕاج" و پلە بەپلە نزیک خستنەوەی خاوەنەکەیەتی لە تیـاچوون، ئەویـش لە کارلێـک و تەئـسیری شـەیاتین و مـوبطلینەوەیە، و پێـوەر لەوەدا موافەقەیەتی بۆ قوڕئان و سوننەت یان موخالەفەیەتی بۆیان.

١٤ – ئیمانداران هەموویان ئەولیای خودان، و هەموو ئیمانـدارێک بەئەندازەی ئیمانەکەی ولایەتی تێدا هەیە.

## بەشی سێیەم:

## تەوحیدی ئیرادی تەڵەبی (تەوحیدی ئولوهییەت)

١ – الله یەکە و تاکە، شەریکی نییە لە خواییەتی "ربوبیة "و پەرستراوێتی "الوهیة "و ناوەکانی و سیفەتەکانیدا، ئەو خوداوەندی جیهانەکان و هەر ئەویش بەتەنها شایستەیە بۆ هەموو جۆرەکانی عبادەت.

٢ – لادانی هەرجۆرێک لە جۆرەکانی عبادەت وەک نزا و پاڕانەوە و هانا و هاوار بۆبردن و مەدەد و یارمەتی خواستن و نەزر و قوربانی و سەربڕین و سجودبردن و تەوەکول و خەوف و رەجا و حوب و هاوشێوەیان لە جۆرەکانی عبادەت بۆ غەیری الله شرک و هاوبەش سازییە، جا مەقصود و مەبەستی بەوە فریشتەیەک بێت یان پێغەمبەرێک بێت یان وەلی و شێخێک بێت یان بەندەیەکی ساڵح بێت یان غەیری ئەوان و هەرکەس و هەرشتێک بێت.

٣ – یەکێک لە بنەماکانی عبادەت ئەوەیە کە الله بەخەوف و رەجا و خۆشەویستییەوە بپەرسترێ، چون پەرستنی بەهەندێکیان بەبێ ئەوانی دیکەیان گومڕاهییە. یەکێک لە زانایان فەرمویەتی:

"من عبدالله بالحب وحده فهو زنديق، ومن عبده بالخوف فهو حروري، ومن عبده بالرجاء وحده فهو مرجئ، ومن عبده بالحب والخوف والرجاء فهو مؤمن موحد".

واتە: ئەوەی بەتەنیا حوببەوە عبادەتی الله بکات زندیقە، ئەوەشی بەتەنیا ترسەوە عبادەتی بکات حەرورییە، ئەوەشی بەتەنیا ئومێدەوە عبادەتی بکات مورجئە، ئەوەشی بە حوب و خەوف و رەجاوە عبادەتی بکات ئەو کەسە "مؤمن"و "موحد"ە.

٤ – تەسلیم و رازیبون و طاعەتی موطلەق "واتە: گوێڕایەڵی رەها "هەر بۆ الله و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، و ئیمان بەوەی الله حەکەمە لە ئیمـــــانە بەوەی "رب "و "اله"ە، واتە: لە ئیمـــــانە بەوەی خـــــودا و پەرستراوە، هیچ شەریکێکی نییە لە "حوکم "و "امر "یدا. و تەشریعی ئەوەی ئەو ئیـزن و رێـگەی پـێ نەدابێـت و تەحـاکوم بـۆ تـاغوت و پێڕەوکردنی غەیری شەریعەتی محمد ﷺو تەبدیل و گۆڕینی شتێک لێـی بەشتێکی تـر کوفرە، و ئەوەشی پێـی وابێ کە کەسێک بـۆی هەیە لە شەریعەتی محمد ﷺدەرچێت ئەوە کافر بووە.

٥ – حوکم بەغەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە کوفری گەورەیە ؛ و کەم وائەبێ "کفر دون کفر" بێت، واتە: کوفری بچوک بێت.

جـــا یەکەم "واتە: کـــوفری گەورە ": ئیلتـــزام و پابەنـــدبوونە بەشەرعێکەوە یان یاساییەکەوە غەیری شەرعی "الله "، یـان تەجـویز و رەوایەتیدانە بەحوکم بەو شەرع و یاسەیەوە.

دووەم "واتە: کوفری بچوک ": لادانە لە شەرعی الـلە، لە واقـعە و شتێکی دیاریکراودا لەبەر هەوا و ئـارەزوو لەگەڵ ئیلتـزام و پابەنـدبوون بەشەرعی "الله"وە.

٦ – دابەشکردنی دین بۆ حەقیقەت خاصـە پێـی جیـا بێـتەوە و بـۆ شـەریعەت عـامـە پێـوەی پابەنـدبێت بـێ خاصـە، و جیـاکردنەوەی سیاسـەت یـان هەرچـی تـر لە دیـن بـاتڵە، بەڵ هەرچـی موخـالەفەی شەریعەت بێت لە حەقیقەت یـان سیاسـەت یـان هەرچـی تـر، ئەوە یـان کوفرە، یان گومڕاهییە، بەپێی پلە و دەرەجەکەی.

٧ – هیچ کەسێک غەیب نازانێ ئیللا الـلە نەبـێ بەتـاک و تەنها، ئیعتقاد و باوەڕبوون بەوەی کە کەسێک هەیە غەیری الله غەیب ئەزانـێ

ئەوە كوفرە، لەگەڵ ئیمان و باوەڕبوون بەوەی كە اللە هەندێك لە پێغەمبەرانی ئاگادار كردووە بەسەر شتێك لە غەیبدا.

٨ – ئیعتقاد بەراستگۆیی ساحرەكان و كاهینەكان و عەرافەكان و جوكییەكان و نجومگەرەكان كوفرە، و چوون بۆ لایان كەبیرەیە، واتە: گوناهی گەورەیە.

٩ – ئەو وەسیلەیەی لە قورئاندا فەرمانی پێكراوە ئەوەیە خۆی پێ نزیك ئەكرێتەوە بۆ لای اللە لە طاعاتی ڕێپێدراو، وە "توسل" سێ جۆرە:

ا – جۆرێكی ڕێپێدراوە: ئەویش تەوەسولە بۆ اللە بە نزا و پاڕانەوە و داواكردن بەناوەكانی و سیفەتەكانی، یان بەئیمان و كردەوەی چاك، یان بەدوعای بەندەیەكیساڵحی زیندوو.

ب – جۆرێكی بدعییە: ئەویش تەوەسولە بۆ اللە بەوەی لە شەرعدا وارد نەبوبێ، وەك تەوەسول بەزەواتی پێغەمبەران و ئەولیا و ساڵحان یان بەجاهیان، یان بەحەقیان، یان بەحورمەتیان و هاوشێوەی ئەوە، لەگەڵ داننانمان بە جاە و حەق و حورمەتیاندا.

ج – جۆرێكی شركییە: ئەویش كردنی مردووان بەواسیتە لە عبادەت و دوعا و داواكردنی مناڵ و رزق و ڕۆزی و داوای جێبەجێكردنی پێویستییەكان لێیان و خواستنی مەدەد و ئیستعانە پێیان و هاوشێوەی ئەوە.

١٠ – بەرەكەت لە "اللە" وەیە، هەندێك لە خەلق و بەندەكانی تایبەت ئەكات بەهەندێك لەوەی ئەیەوێ لەبەرەكەت، جا بەرەكەت لە هیچ شتێكدا سابت نابێت ئیللا بەبەڵگەی شەرعی نەبێ.

بەرەكەت، واتە: زۆر و زیادی خێر، یان جێگیربی و لازمبونی.

ئەویش "واتە: بەرەكەت" لە زەماندا وەک شەوی قەدر.

وە لە مەكاندا وەک سێ مزگەوتەكە مسجدالحرام و مسجد النبوي و مسجد الاقصى.

وە لە شتەكانیشدا وەک ئاوی زەمزەم.

وە لە كردەوەكانیشدا هەموو كردەوەیەكی چاک موبارەكە.

وە لە كەسەكانیشدا، وەک زەواتی پێغەمبەرەكان، بەڵام تەبەڕوک بەزەوات و ئاساری هیچ كەسێک جائیز نییە ئیللا بەزات و ئاساری پێغەمبەر ﷺ نەبێ، چون بەڵگە بەغەیری ئەوە نەهاتووە، وە ئەوەش بەمردنی و نەمانی ئاساری پچڕاوە و لە بەین چووە.

١١ – تەبەڕوک لە ئومور و كاروبارگەلی تەوقیفییە، واتە: بەبەڵگە سابت بووە، بۆیە تەبەڕوک بەهیچ شتێک جائیز نییە ئیللا بەوە نەبێ بەڵگە پێی هاتووە و وارد بووە.

١٢ – كردارەكانی خەڵک لەلای گۆڕەكاندا و زیارەتكردنیان، ئەوانیش سێ جۆریان هەیە:

یەكەم: ڕێپێدراوە: ئەویش زیارەتیانە بۆ بیرهاتنەوەی ئاخیرەت و سەلام كردن لە ئەهلەكەیان و دوعاكردن بۆیان.

دووەم: بدعی یە و موونافی كەماڵی تەوحیدە، بەو مانایەی تەبا و كۆک وساز نییە لەگەڵ كەماڵی تەوحیددا و وەسیلەیەكە لە وەسیلەكانی شرک، چون قەصد و نیاز و مەبەست بەم جۆرە عبادەت و تەقەڕوب و نزیک كەوتنەوەیە لە "اللە" لەلایاندا، یان قەصد و نیاز و مەبەست تەبەڕوكە پێیان، یان هەدیەكردنی پاداشتی خێری قورئانە لەلایاندا، و بیناكردن لەسەریان و هەڵبەستنیان و داگیرساندنی مۆم و گڵۆپ و روناككردنەوەیان و كردنیانە بەجێگەی نوێژ و سەفەركردن بۆلایان و

هاشێوەی ئەوە لەوەی شارع نەهی لێکردووە، یان لەوەی هیچ ئەسڵێکی نییە لە شەرعدا.

سێیەم: شرکییە: ئەویش مونافاتی لەگەڵ تەوحیددا هەیە و لەگەڵیدا تەبا و کۆک و ساز نییە، چون لادانی جۆرێکە لە جۆرەکانی عبادەت بۆ خاوەنی گۆڕەکە، وەک پاڕانەوەی لێی و داوای مەدەد و کۆمەک و هاوارلێکردن و تەواف و خولانەوە بەدەوریدا و سەربڕینی ئاژەڵ و نەزر بۆی و هاوشێوەی ئەوە.

١٣ – وەسیلەکان حوکمی مەقصەدەکانیان هەیە، و هەر زەریعە و وەسیلەیەک سەربکێشێت بۆ شرک لە عبادەتی "الله "دا، یان ئیبتداع و تازەگەری لە دیندا ئەبێ سەد بکرێ و پێشی پێبگیرێ، چون هەموو تازەگەری و داهێنراوێک لەدیندا بدعە و زیادەیە و هەموو بدعەو زیادەیەکیش گومڕاهییە.

### بەشی چوارەم: ئیمان

١ – ئیمان قسە و کردەوەیە، زیاد ئەکات و کەم ئەکات، ئەویش: قسەی دڵ و زمان، و کردەوەی دڵ و زمان و پەلەکانە. ( پەلەکان: ئەندامەکانی لاشە وەک قاچ و دەست و ئەوانی تر ).

جا قسەی دڵ: ئیعتقاد و تەصدیق و باوەڕییەتی، و قسەی زمانیش: ئیقرارو پێلێنانییەتی، و کردەوەی دڵ: تەسلیم بوون و ئیخلاص و ئیذعان و ملکەچی و خۆشەویستی و ئیرادە و ویستییەتی بۆ کردەوە و ئەعمالی چاکە.

کردەوەی پەلەکان "عمل الجوارح": ئەنجامدانی فەرمانپێکراوەکان و تەرکی نەهیلێکراوەکانە.

٢ – ئەوەی کردەوە لە ئیمان دەربکات ئەوە "مرجئ"ە، و ئەوەشی شتێک بهێنێتە ناو ئیمانەوە و لە ئیمان نەبێت، ئەوە موبتەدیع و بدعەکارە.

٣ – ئەوەی ئیقراڕی بەدوو شەهادەتەکە نەکرد، ناوی ئیمان و حوکمی ئیمانی نە لە دونیا و نە لە ئاخیرەتدا بۆ سابت نابێت.

٤ – ئیمان و ئیسلام دوو ناوی شەرعین لەنێوانیاندا عموم و خصوص هەیە لە رویەکەوە، کاتێک جیابوون هەردووکیان بەیەک مانا و واتا دێن و کاتێک پێکەوە بوون هەر یەکێکیان بەمانا و واتای خۆی دێت، و ئەهلی قبلە و ئەهلی ئیمان و ئیسلام "مؤمن"و موسڵمانیان پێدەوترێت.

٥ – ئەنجامدەری گوناهی گەورە لە ئیمان دەرناچێت، ئەوەی گوناهی گەورە ئەنجام ئەدات لە دنیادا "ناقص الایمان"ە، واتە: کەم و کورتی لە ئیمانیدا هەیە، و لە ئاخیرەتیشدا – ئەگەر تەوبەی نەکرد و مرد – لە ژێر مەشیئەت و ویستی الله دایە ئەگەر ویستی لێبوو لێی خۆش دەبێ و ئەگەر ویستیشی لێبوو سزای ئەدات و پاک ئەبێتەوە و بەپاکی ئەچێتە بەهەشتەوە، و ئەهلی تەوحید موسڵمانان مەصیری هەموویان بۆ بەهەشتە ئەگەرچی لەناویشیاندا هەبێ بەئاگر سزا بدرێت، هیچ یەکێکیشیان بەهەمیشەیی هەرگیز لە ئاگردا نامێنێتەوە.

٦ – جائیز نییە بۆ کەسێکی دیاریکراو لە ئەهلی قبلە بەقەتعی شاهێدی بدەیت و بڵێیت لە بەهەشتدایە یان لە ئاگردایە ئیللا ئەوە نەبێ دەق لە حەقیدا سابت بووبێ، بەڵ هیوا ئەخوازین چاکەکاریان جێگای بەهەشت بێت و ئەترسین خراپەکاریان لە ئاگردا خوا سزای بدات.


CamScanner

٧ – کوفر لە ئەلفازی شەرعیدا دوو بەشە: بەشێکیان کوفری گەورەیە، ئەویش ئەوەیە خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام دەرئەکات، ئەویش وەک تەبدیل و گۆڕینی شتێک لە شەریعەت بەشتێکی تر، و کوفری بچوک، ئەمە غەیری ئەوەیە کە لە ئیسلام دەری ئەکات، بەڵ ئەمە دەری ناکات و ئەحیانەن ناوئەبرێ بەکوفری عەمەلی، ئەویش وەک جەنگ کردنی موسڵمان لەگەڵ موسڵمان.

٨ – تەکفیر لە ئەحکامی شەرعییە و مەرەد و مەرجەعیان بۆ قورئان و سوننەیە، جا تەکفیری هیچ موسڵمانێک بەقسەیەک یان بەکردارێک جائیز نییە تا بەڵگەی شەرعی نەبێ دەلالەت لەسەر ئەوە بکات، وە لە "اطلاق "و دابڕینی حوکمی کوفر بەسەر قسەیەک یان کردارێکدا سابت بوونی موجبەکەی لازم نابێ لە حەقی کەسی دیاریکراودا مەگەر کاتێک نەبێ کە مەرجەکانی تەکفیر تەحەقوقیان بووبێت و رێگرەکان و مانعەعەکانی تەکفیر مونتەفی بن، واتە: هیچیان نەبن.

تەکفیر لە مەترسیدارترینی ئەحکامە، بۆیە "تثبت "و رونکردنەوە و حەزەر وریایی واجب ئەبێ لە تەکفیری موسڵماندا.

**بەشی پێنجەم: قورئان و کەلامی خودا**

١ – قورئان کەلام و فەرمایشتی اللە یە بەپیتەکان و ماناکانییەوە، دابەزێنراوە غەیر مەخلوقە، لەوەوە دەستی پێکردووە و بۆ لای ئەویش ئەگەڕێتەوە، موعجزە، بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی ئەوەی پێییەوە هاتووە، واتە: بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی پێغەمبەر محمد ﷺ، و پارێزراوە هەتا رۆژی قیامەت.

٢ – الله تعالى دەدوێ و دەپەیڤێ بەوەی ویستی لێبێت، کەی و کەنگێ ویستی لێبێت، چۆن ویستی لێبێت، کەلام و فەرمایشتی الله حەقیقەتە، بەپیت و دەنگ، چۆنییەتەکە نازانین و ڕۆناچین تێیدا.

٣ – قەول و گوفتار بەوەی کەلام و فەرمایشتی الله مانایەکی نەفسی بێت، یان قورئان حکایەت، یان عبارەت، یان مەجاز، یان فەیز و هاوشێوەیان بێت زەیغ و لادان و گومڕاهییە، و ئەشبێ کوفریش بێت.

٤ – ئەوەی ئینکاری شتێک لە قورئان بکات، یان ئیددیعای کەم و کورتی، یان زیادە، یان تەحریف و گۆڕینی تێدا بکات، ئەوە کافرە.

٥ – قورئان ئەبێ بەوەی زانراوە لە مەنهەجی سەلەف و ڕۆچووان "راسخون" لە زانستدا تەفسیر بکرێ، و تەفسیری قورئان بەرەئی موجەڕەد جائیز نییە، چون ئەوە لە گوفتارە لەسەر الله بەبێ زانست، وە تەئویل کردنیشی بەتەئویلاتی "باطنیة" و "رافضة" و هاوشێوەیان کوفرە.

**بەشی شەشەم: قەدەر**

١ – روکنێک لە ئەرکان و روکنەکانی ئیمان، ئیمانە بەوەی قەدەر خێر و شەڕی لە "الله"وەیە، ئەویش ئیمان بەهەموو دەقەکانی قەدەر و پلەکان و مەرتەبەکانی "زانست و نوسین و ویست و ئافراندن "ئەگرێتەوە، و هیچ گێڕەرەوە و پوچکەرەوەیەک نییە بۆ قەزا و حوکم و بڕیاری ئەو. واتە: هیچ کەسێک نییە بتوانێ قەزا و حوکمی کەونی "الله" رەد و پوچ بکاتەوە چ بەگۆڕین و چ بەنەقص و کەم و کورتی دروست کردن تێیدا.

٢ – ئیرادە و ئەمری وارد و هاتوو لە قورئان و سوننەدا دوو جۆرە:

ا – ئیرادەی کەونی قەدەری "بەمانای ویست، مەشیئەت"، ئەویش وەک ئەوەی ویستی لەسەر هەر شتێک ببێ بیکا ئەیکا، وە ئەمری کەونی قەدەری، ئەویش وەک ئەوەی بەشتێک بفەرموێ ببێ دەستبەجێ ئەبێ "کن فیکون ".

ب – ئیرادەی شەرعی، هەڵبەت لەم جۆرەدا مەحەببەتی خودا لازم دێت بۆ ئەوەی ویستویەتی لە بەندەکان، ئەویش وەک ویست و مەحەببەتی خودا بۆ عەدل، خودا خۆشی بەعەدل دێت و حەزی پێیەتی، وە ئەمری شەرعی، ئەویش وەک ئەمر بەعەدل و ئیحسان و... هتد.

ئافرێنراو "مەخلوق "خاوەنی ئیرادە و مەشیئەتە، بەڵام ئیرادە و مەشیئەتەکەی تابعی ئیرادە و مەشیئەتی ئافرێنەر "خالق"ە.

٣ – هیدایەت و گومڕاهی بەندەکان بەدەستی خودایە، جا لەناویاندا کەسانێک هەن خودا بەفەزڵی خۆی هیدایەتی داون یان هیدایەتیان ئەدا، وە لەناویشیاندا کەسانێک هەن لەبەر لاسارییان و هەڵبژاردنیان بۆ گومڕایی خودا بەعەدلی خۆی وێڵی کردوون یان وێڵیان ئەکات.

٤ – خودا بەندەکان و کردارەکانیانی خولقاندووە، هیچ خولقێنەرێک غەیری ئەو نییە، هەر ئەو خولقێنەرە بۆ کردارەکانیان، و بەندەکان بکەر و ئەنجامدەریانن لەسەر حەقیقەت.

٥ – ئیسپاتی حیکمەت لە کردارەکانی "اللە"دا، و ئیسپاتی کاریگەری و تەئسیری هۆیەکان بەویستی "اللە"یە سبحانە وتعالی.

٦ – ئاکامەکان "آجال" و ئەرزاق و هەر یەکە لە "سەعادەت "سپیچارەیی و "شەقاوەت" سیاچارەیی نوسراوە و ئەرزاقیش بەشکراوە بەر لە ئەفراندنیان. واتە: خودا ئەجەل و ئاکام و سپیچارەیی و

سیاچارەیی و رزق و بژێوی خەڵک و هەموو شتێکی زانیون بەر لەوەی خەلقیان بکات، واتە: خودا زانیویەتی بەندەکان چەند ئەژین و کەی ئەمرن و چی و چەند ئەخۆن و چی و چەند ئەنۆشن و چی و چەند ئەپۆشن و کێ سپیچارە و کێ سیاچارەیە پاشان نوسیویەتی بەر لە ئافراندنیان. بەڵ علم و زانستی تەواوی بەوە و بەورد و درشت و هەموو شتێکیان بووە پاشان نوسیویەتی بەر لە ئافراندنیان.

هەڵبەت ئەمە دژبەیەکی نییە لەگەڵ ئەوەی کە خەڵک هەندێکیان ستەم لە هەندێکیان ئەکەن و مافەکانیان زەوت ئەکەن و...هتد، وە خودا لەسەر ئەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکات و سزای ستەمکاران ئەدات.

٧ – ئیحتجاج بەقەدەر لەسەر تووشهات و ئازارەکان جائیزە، واتە: بە حوجە و بەڵگە کردنی قەدەر لە بەڵاکان و ئازارەکاندا جائیزە، یانی جائیزە بڵێی بەڵا ئازار و نەخۆشی و موسیبەت قەدەرە، بەڵام ئیحتجاج بەقەدەر لەسەر نەنگییەکان و گوناهەکان جائیز نییە، واتە: جائیز نییە تاوان و گوناە بکات و بڵێ ئەوە لە چارەم نوسرابوو هەر ئەبوو ئەنجامم بدابایە، بەڵ تەوبەلێکردنیان "واجب"ە، و لۆمەی بکەر و ئەنجامدەریشیان لەسەری ئەکرێ.

٨ – دابڕان "انقطاع "بۆ هۆیەکان شرکە لە تەوحیددا، و رووەرچەرخان لە هۆیەکانیش بەکوللی، قەدح و تانوتدانە لە شەرع، و نەفی کاریگەری هۆیەکان موخالفە بۆ شەرع و عەقڵ، تەوەکول و ئیعتماد لەسەر "الله" پێچەوانە نییە لەگەڵ گرتنەبەری هۆیەکاندا.

## بەشی حەوتەم: جەماعەت و ئیمامەت

١ – جەماعەت – لەم بابەدا – یاوەرانی پێغەمبەر، صلی الله علیه وسلم، و پێڕەوکارانیانن بەچاکە و ئیحسان، دەستگرتووانن بەئاساری ئەوان هەتا ڕۆژی قیامەت، ئەوانیشن کۆمەڵی ڕزگاربوو. هەر کەسێک پابەند بێت بەمەنهەجی ئەوانەوە، ئەوە لە جەماعەیە، ئەگەرچی لە هەندێک جوزئییاتدا هەڵەش بکات.

٢ – تەفەڕوق و کۆمەڵ کۆمەڵ بوون لە ئاییندا و فیتنە و ئاژاوەگێڕی لە نێوان موسڵماناندا جائیز نییە، و ئەوەی موسڵمانان ئیختلاف و ڕاجیاییان تێیدا هەیە ئەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ کتابی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، و ئەوەی سەلەفی ساڵحی لەسەر بووە.

٣ – ئەوەی لە جەماعە دەرچوو، نوسح و دەعوە و موجادەلە لەگەڵیدا بەجوانترین شێواز و ئیقامە حوججە لەسەری واجب ئەبێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ جەماعەت ئەوە باشە، وە ئەگەرنا شەرعەن سزا ئەدرێ بەوەی شایستەی بێت.

ئاگاداری: ئەوەی سزای ئەدا ئیمامی موسڵمانان یان جێگرەکەیەتی.

٤ – هەڵنانی خەڵک لەسەر ڕستەگەلی جێگیر بەکتاب و سوننەت و ئیجماع "واجب "ە، و تاقیکردنەوەی ڕەشەخەڵک و عاممەی موسڵمانان بەکاروبارگەلی ورد و ماناگەلی قوڵ "لە دیندا" جائیز نییە. واتە: جائیز نییە عاممەی موسڵمانانیان پێ تاقی بکەیتەوە.

٥ – ئەسڵ لە هەموو موسڵماناندا سەلامەتی قەست و موعتقەدە، هەتا خیلافی ئەوە بەدیار ئەکەوێ، وە ئەسڵ لە قسە و پەیڤینیشیاندا حەملکردنیەتی بۆسەر مەحمەلێکی جوان، واتە قسەو پەیڤینیان ئیعتبار

بەباش و شایستە بەخۆی بۆ دەکرێ، وە ئەوەی عنادی و قەستی خراپی لێوە بەدیارکەوت، جائیز نییە تەکەلوفی تەئویلاتی بۆ بکرێ.

٦ – کۆمەڵەکانی ئەهلی قیبلە ئەوانەی لە سوننەت و رێگەی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون، هەڕەشەیان بەتیاچوون و بەدۆزەخ لێکراوە، حوکمیان حوکمی تێکڕای ئەهلی وەعیدە، ئیللا ئەوەیان نەبێ کە لە باتن و ناخدا کافر بێت.

ئەو کۆمەڵانەی لە ئیسلام دەرچوون تێکڕا "في الجملة" کافرن و حوکمیان حوکمی موڕتەدینە. واتە: حوکمی ئەو عەرەبانەیان هەیە موڕتەد بوونەوە و ابوبکر سوپای ناردە سەریان و جەنگی لەگەڵیاندا کرد هەتا دایمرکاندنەوە.

٧ – جومعە و جەماعەت لە گەورەترین شەعائر و دروشمگەلی ئیسلامیی زاهیری و رواڵەتییە، و نوێژ لە دوای "مستور الحال" لە موسڵمانان دروستە، و تەرک و وازلێهێنانی بەدەعوای جەهالەتی حاڵی بدعەیە.

مستورالحال: ئەو ئیمامەیە بەڕواڵەت عادل و خاوەنی عەقیدەیەکی دروست بێت ئیتر لەوە بەولاوە علم و زانیاریمان بە حاڵی نەبێت.

٨ – نوێژ لە دوای ئیمامێکەوە جائیز نییە ئیزهاری بدعە، یان خراپەکاری بکات، واتە: نوێژ لە پشتی ئیمامێکەوە دروست نییە بەدیارچاوی خەڵکەوە بدعە بکات یان بەدیار چاویانەوە خراپە بکات، لەگەڵ ئیمکان و گونجانی لە دوای کەسێکی ترەوە، وە ئەگەر کەسێک نوێژی لە دوای ئیمامێکی لەو شێوەیەوە کرد بوو نوێژەکەی دروست بووە، و ئەنجامدەرەکەی، واتە: نوێژخوێنەکە گوناهبار ئەبێ ئیللا مەگەر قەستی دەفعی زیان و مەفسەدەیەکی گەورەتر بوو بێت، جا ئەگەر


CamScanner

کەسێک نەبوو ئیللا وێنەی ئەو نەبێ، یان هەبوو بەڵام لەو خراپتر بوو، ئەوکات لەپشتییەوە جائیزە، و تەرک و وازلێهێنانی جائیز نییە.

وە ئەوەی حوکم بەکوفری کرابێ نوێژ لە پشتییەوە دروست نییە.

٩ – ئیمامەتی کوبرا، پێشەوایەتی گەورە بەئیجماع و کۆدەنگی ئوممەت، یان بەبەیعەتی ئەهلی حەل و عەقد لە موسڵمانان سابت ئەبێ، وە ئەوەی لە موسڵمانان بەهێز و قەهر تەغەلوبی کرد، و کاروباری موسڵمانانی بەدەست گرت هەتا موسڵمانان کەلیمەیان لەسەری کۆبوویەوە و رێککەوتن لەسەری، طاعەت و گوێڕایەڵی بە چاکە و مەعروف و موناصەحە و ئامۆژگاری واجب ئەبێت، و دەرچوون لەسەری حەرام ئەبێ مەگەر کاتێک نەبێ کوفرێکی بەواح و دیاری لێوە بەدیارکەوێ، و بورهان و بەڵگە لە خوداوە تێیدا هەبێت.

١٠ – نوێژ و حەج و جیهاد، شان بەشانی ئیمامگەلی موسڵمانان واجبە ئەگەرچی ستەمیشیان هەبوو.

١١ – جەنگ و کوشتار لە نێوان موسڵماناندا لەسەر دنیا، یان لەسەر حەمییە و دەمارگیری جاهلییەت حەڕامە و لە گەورەترینی کەبائیر و گوناهە گەورەکانە، بەڵام جەنگ و کوشتاری ئەهلی بدعە و یاخیبووان و هاوشێوەکانیان جائیزە ئەگەر دەفع کردنیان بەکەمتر لەوە گونجاو نەبوو، وە هەندێک جار بە پێی حاڵ و بەرژەوەندی واجب ئەبێ.

١٢ – یارانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ و رضي الله عنهم هەموویان "عدول" دادگەر بوون، و باشترینی ئەم ئوممەتە بوون، شاهێدی بۆدانیان بەئیمان و فەزڵ ئەسڵ و بنەمایەکی قەتعی زانراوە لە ئاییندا بەزەرورەت، و خۆشەویستیان دین و ئیمانە، بوغز و رقلێبوونیان کوفر

و نفاقه، لەگەڵ زمان گرتن و وازهێنان لەوەی رووی داوه له نێوانیانـدا له شەڕ، و تەرکی رۆچوون تێیدا بەشتێک قەدح و توانج بدات له قەدر و ڕێز و عەدالەتیان.

وه باشترینیان ابوبکر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي یه رضـي اللـه عـنهم، و ئەوانیـشن خولەفـای راشـدین. وه خـیلافەت و جنشینایەتی هەر یەکێکیان بەپێی ریزبەندییان سابت و جێگیر ئەبێت.

١٣ – وه خۆشەویستی ئالی بەیت و بنەماڵەی رسول اللـه ﷺ، و دۆسـتایەتییان، و گەورەڕاگرتنـی قەدر و ڕێـزی هاوسـەرەکانی دایکـانی ئیمانداران، و زانینـی فەزڵیـان، و خۆشەویـستی ئیمامـانی سـەلەف، و عولەمـای سوننه و تـابعین و شوێنکەوتوانیان بەچـاکه و ئیحـسان، و کەنارگیری و دوور کەوتنەوه له ئەهلی بیدەع و هەواکان له ئایینه.

١٤ – جیهـاد له ڕێـگەی اللـه دا چڵەپـۆپه و لـوتکەی ئیـسلامه، و بەردەوام ئەبێ هەتا رۆژی قیامەت.

١٥ – ئەمـر به چـاکه "مەعـروف "و نەهـی له خـراپه "مـونکەر" له گەورەترین شەعیرەکان و دروشمەکانی ئیـسلام، و هۆیەکـانی پاراسـتنی جەماعه و کۆمەڵی موسڵمانانه، و هەردووکیـان واجـبن بەپێـی تـاقەت و توانا، وه بەرژەوەندی موعتەبەره لەوەشدا.

## بەشی هەشتەم:

## گرنگترین نیشانەکان و تایبەتمەندییەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت

ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کۆمەڵی رزگاربوو، و تائیفەی یارمەتیدراوە، جا لەگەڵ تەفاوتیان لە نێوان خۆیاندا نیشانەگەل و تایبەتمەندگەلێکیان هەیە لە غەیری خۆیان جیایان ئەکاتەوە، لەوانە:

١ – گرنگیدان بەکتێبی خودا بەلەبەرکردن و خوێندنەوە و تەفسیر و تێرامان، و گرنگیدان بەفەرمووده، بەناسین و تێگەیشتن و جیاکردنەوەی ساغی لە نەخۆشی"واتە: دروستی لە نادروستی"، لەگەڵ کارکردن بەزانست و پێڕەوکردنیدا، چون قورئان و فەرمووده دوو سەرچاوە سەرەکییەکەی لێوەرگرتنی ئایینن.

٢ – چونەناو ئایینەوە هەمووی، و ئیمان بەقورئان هەمووی، ئەهلی سوننەت و جەماعەت بڕوایان بەدەقەکانی وەعد و وەعید و دەقەکانی ئیسپات و دەقەکانی "تنزیە "پاکڕاگرتنی الله لە هەموو نەنگی و کەموکورتییەک هەیە، و جەمع ئەکەن لە نێوان ئیمان بەقەدەری خوا و ئیسپاتی ئیرادە و ویست و کرداری بەندەدا، وەک ئەوەی جەمع ئەکەن لە نێوان زانست و پەرستشدا، و لە نێوان هێز و بەزەیی و لە نێوان کارکردن بەهۆیەکان و زوهد. واتە: پشتکردن لە دنیا و رووکردن لە ئاخیرەت و ئیساردانی بەسەر دنیادا.

وەعد، واتە: بەڵێندان بەخێر. وەعید، واتە: هەڕەشەکردن بەشەڕ.

٣ – ئیتتباع، واتە: شوێنکەوتنی سوننەت، و وازهێنان لە ئیبتداع، واتە: لە بدعەچێتی، و توڕدانی پەرتەوازەیی و ئیختلاف لە ئاییندا.

٤ – ئیقتدا و ئیهتدا بەپێشەوایانی هودا و ڕێنومایی دادگەرەوە، واتە: شوێنکەوتنی ئەوانەی موقتەدا بوون بۆ خەڵک و ئیقتداپێوەکراو بوون لە زانست و کردەوە و بانگەوازدا – لە صەحابە و ئەوانەی لەسەر نەهج و ڕێبازی ئەوان ڕۆشتوون – و دوورەپەرێزی لە نەهج و ڕێبازی ئەوانەی موخالەفەی ڕێگەی ئەوانیان کردووە.

٥ – میانەگری "توسط": ئەوان لە "ئیعتقاد"دا میانەن لە نێوان گروپەکانی زێدەڕەوی و گروپەکانی کورتڕەوی، و میانەن لە کردەوەکان و سلوکیشدا لە نێوان زێدەڕەوان و کورتڕەواندا.

٦ – مکوڕبون و سوربون لەسەر جەمع و کۆکردنەوەی وشەی موسڵمانان لەسەر حەق و یەکڕیزییان لەسەر تەوحید و ئیتتباع، و دورخستنەوەی هەموو ئەسباب و هۆیەکانی نیزاع و خیلاف و ناکۆکی لە نێوانیاندا.

وە لێرەشەوە لە بنەماکانی ئاییندا لە ئوممەت جیانابنەوە بەناوی غەیری سوننەت و جەماعەتەوە، و دۆستایەتی و دوژمنایەتی ناکەن لەسەر غەیری ئیسلام و سوننەت.

٧ – بانگەواز بۆ الله، و فەرمان بەچاکە، و ڕێگری لە خراپە، و جیهاد، و زیندوکردنەوەی سوننەت و کار بۆ نوێکردنەوەی دین؛ و ئیقامە و هەڵساندنەوەی شەرع و حوکمی الله لە هەموو ورد و درشتێکدا.

٨ – عەدل و ئینساف: ئەوان بۆ هەمیشە ڕەچاوی مافی خودا ئەکەن نەک مافی نەفس یان مافی تائیفە "طائفەی مەنصورە"، وە لەبەر ئەمە زێدەڕەوی لە موالیدا ناکەن "واتە: زێدەڕەوی لەوکەسەدا ناکەن دۆستایەتییان دەکات"، و ستەم لە موعادییش ناکەن "واتە ستەم

لەوکەسەش ناکەن دوژمنایەتییان دەکات"، و لە فەزڵی خاوەن فەزڵیش کەم ناکەنەوە هەر کەسێک بێت.

٩ – رێککەوتن "توافق "لە تێگەیشتنەکان و لێکچون لە هەڵوێستەکاندا بەرەغمی لێکدوربونی وڵاتەکان و سەردەمەکانیان، وە ئەمە لە بەرهەمەکانی یەکبونی سەرچاوە "مصدر "و لێوەرگرتن"تلقي"ە.

١٠ – ئیحسان و رەحمەت و رەوشت جوانی لەگەڵ خەڵکدا تێکڕا.

١١ – دڵسۆزی نواندن "نصیحة" بۆ خودا و بۆ کتێبەکەی و بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، و بۆ پێشەوایانی موسڵمانان و تێکڕایان.

١٢ – گرنگیدان بەکاروباری موسڵمانان و یارمەتیدانیان و سەرخستنیان، و ئەدای مافەکانیان، و مەنعکردنی ئازار لێیان "بەپێی توانا ".

تەواو بوو، لله الحمد والمنة.

شەوی ١٦ / ربیع الاخر / ١٤٤٠ ک دەستم پێکرد و لە شەوی ١٧ لەسەر ١٨ / ربیع الاخر / ١٤٤٠ ک بەرامبەر ٢٤/ ١٢ / ٢٠١٨ ز لە کاتی نەخۆشییەکەمدا لێبوومەوە، ئەمڕۆش هەینی ٢٣/ محرم / ١٤٤٢ ک بەرامبەر ١١ / ٩ / ٢٠٢٠ ز بەشی کۆتایی ئەوەی مابوو پۆستم کرد، لله الحمد والمنة.